دیوەودیو ببن، دەنکێ چەند کونی وای تێ بکا. لە وەختی نوستنا ئەو دەنکانە قووت بدا، یەك دوو شەو وا بکا سێبەڕۆکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٣٦٦. ئەڵێن: بۆن کردنی ڕەیحانە بۆ هەڵامەت باشە.

٣٦٧. ئەڵێن: ئەگەر مار چاوی بە ئینسانی ڕووت بکەوێ لێی هەڵدێ.

٣٦٨. ئەڵێن: چای وشك لەگەڵ زەردێنەی هێلکە بکرێ بە مەعجوون و بکرێ بە شاف ئەو کەسەی سکی ئەچێ هەڵیگرێ بۆی باشە.

٣٦٩. ئەڵێن: یەکێ «وشکەبیرۆ»ی هەبوو لیمۆی ترش بە توێکڵەکەیەوە بەسەر یەکا بگووشرێ و ئاوەکەی بگیرێ، سێ ئیستکان لەو ئاوە بخواتەوە چاك ئەبێتەوە.

٣٧٠. ئەڵێن: یەکێ نەخۆشی شەکری هەبوو ناوکی خورما بهاڕێتەوە ورد ورد. پاشان وەکوو قاوە لێی بنێ و بیخواتەوە چاك ئەبێتەوە.

٣٧١. ئەڵێن: یەکێ هەر ئەڕشایەوە قۆنیاخی بدەنێ چاك ئەبێتەوە.

٣٧٢. ئەڵێن: یەکێ پێکەنین بیگرێ سەیری نینۆکی خۆی بکا پێکەنینەکەی لا ئەچێ.

٣٧٣. ئەڵێن: لەو کوردەوارییە لە ئاواییێکا کە سەگی ڕەش لوورانی، ئەوە بەڵایەك دێت بەسەر ئەو ئاواییەدا و سەگەکە لە دوورەوە چاوی لێیە، ئەلوورێنێ ئەڵێ: لەم ئاواییە دوور بێت؛ کە بەڵاکە نزیك کەوتەوە ئەو هەر ئەلوورێنێ و ئەڵێ: لە ماڵی خاوەنەکەم دوور بێت؛ کە بەڵا هات و ڕووبەڕووی ئەو زۆر نزیك کەوتەوە، کلك ئەگرێ بەناو گەڵیا و بە لوورە ئەڕوا و ئەڵێ: «لە خۆم بەدوور بێ».

◈◇◈



عاشقی وشەی خاوێنی کورد، کەلەپیاوی بەدەستوبرد، هۆگری دابونەریتی کوردەواری، کۆکەرەوەی کەلەپوور لە دێهات و شاری، زیندووکەرەوەی شادی، شێخ عەلائەددینی سەججادی.

ناوی «عەلائەددین نەجمەددین عیسامەددین»ە و لە بنەماڵەی ناوداری «سەججادی»یە لە رۆژهەلاتی کوردستان. لە ساڵی ۱۹۰۷ی زایینی لە سنەدا هاتۆتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا پەروەردە کراوە. لە ساڵی ۱۹۳۸ی زایینی ئیجازەی مەلایەتی لای مامۆستا «شێخ بابەعەلی تەکیەیی» وەرگرتووە و چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی «نەعیمە خاتوون» بووە بە پێشنوێژ. لە بەغداش لای مامۆستایان شێخ «ئەمجەدی زەهاوی» و شێخ «محەممەدی قزلجی» بە هەندێ لە زانستە ئیسلامییەکاندا چۆتەوە. لە ساڵی ۱۹۳۹ی زایینیدا چۆتە مەیدانی رۆژنامەنووسی و لە ۱۹٤۱دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری «گەلاوێژ» و وردە وردە بووە بە هەمەکارەی و تا داخستنی لە ۱۹٤۹دا لەگەڵی بووە.

لە ساڵی ۱۹٤۸دا گۆڤاری «نزار»ی بە عەرەبی و کوردی دەرکردووە، کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری و سیاسی بووە. تا ساڵی ۱۹۷٤ مامۆستای وێژە و مێژووی وێژەی کوردی بووە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا. لە ساڵی ۱۹۷٤دا کرا بە ئەمینداری گشتی ئەوقاف و سێ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

ئێوارەی رۆژی پێنجشەممەی ۱۹۸٤/۱۲/۱٤ی زایینی، کۆچی‌دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە نزیکی شێخ عەبدوڕڕەحمانی ئەبولوەفای نەقشبەندی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاک سپێرراوە.

عەلائەددینی سەججادی زیاتر لە چل ساڵ خەریکی زیندووکردنەوەی کەلەپوور و نووسینی مێژووی وێژەی کورد بوو. تێکۆشانی بێ‌وچانی ئەم پایەبەرزە نەیهێشت کە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوەکەمان بفەوتێ.

**ناوی بەرز و ڕۆحی شاد بێت**



انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنندج ـ پاساژ عزتی ـ تلفن: ۳۳۱۶۵۳۸۲



جلد پنجم
9 789649 804163



شابک دوره
9 789649 804118